سرشناسنامه : بهرنگی ، صمد ۱۳۱۸ - ۱۳۴۷
عنوان و نام پدیدآور : مشکی برسی / نوو سه ر سه مه د بیهرنگی؛ وه رگیر عه بدو لرحمان فه هیمی
مشخصات نشر : سنندج ؛ انتشارات علمی کالج ۱۳۸۹ ،
شابک : ۷-۰۵-۵۸۲۷-۶۰۰-۹۷۸
978-600-5827-05-7
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی / گروه سنی : الف ، ب .
موضوع : داستانهای تخیلی
شناسه افزوده : عبدالرحمان فهیمی ، ۱۳۳۴ - مترجم
رده بندی دیویی : ۱۳۸۹ ش م ۸۴۹ ب ۱۳۰ دا
شماره کتابشناسی ملی : ۲۰۸۳۰۱۴


انتشارات علمی کالج

**مشکی برسی**


نویسنده : صمد بهرنگی
مترجم: عبدالرحمان فهیمی
ناشر: انتشارات علمی کالج
مدیر مسئول: کیومرث کرباسی
تصویرگر: سعید صائب
گرافیک: شاهو احمدیان
چاپ و لیتوگرافی: سیمرغ
شمارگان: ۲۰۰۰
قیمت: ۱۵۰۰ تومان

بەنێوی خودا

هەبوو ، نەبوو مشکێک هەبوو ، لە سەحرایەک دەژیا. رۆژێک لە ڕۆژان زۆری برسی بوو.

ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە باخێک. لەو باخە سێدانە سێوی پەیدا کرد و خواردی.

لەو دەمەدا ، بایەک هەڵی کرد و گەڵای دارسێوەکەی بەسەر مشکەکەدا ، وەراند.

مشک تووڕە بوو ، گەڵاکانی خوارد. لەباخ هاتەدەرێ. کابرایەکی دیت گوزەڵەیەک پڕ لـە ئاوی بەدەستە وەبوو. مشکی برسی بە کابرای گوت : «هۆ کابرای گۆزەڵە بەدەست! لـەباخ سێ سێوم خوارد، با هەڵی کرد گەڵای دارەکەی بەسـەرمدا وەرانـد ، گەڵاکانیشـم خـوارد، ئێستا تۆش دەخۆم.» کابرا گوتی:«بەو گۆزەڵە ، یەکێکت لێڕادەکێشم دەس بەجێ دەمری.» مشکی برسی کابرای خوارد.

ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە تازەبووکێک تاوڵەمەی هەڵدەسووڕاند و خەڵووزی دەگەشاندەوە.
بە تازەبووکی گوت : «لەباخ سێ سێوم خوارد، با هەڵی کرد گەڵای دارەکەی بەسەرمدا وەراند، گەڵاکانیشم خوارد، کابرایەک گۆزەڵە بەدەستیشم خوارد، ئێستا تۆش دەخۆم.»
تازەبووک گوتی:«تاوڵەمەیەکت لێڕادەکێشم دادەپڵۆخێی.» مشکی برسی تازەبووکیشی خوارد

ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە پۆلە کچێک، گولدۆزیان دەکرد. بە کچەکانی گوت: «هۆی کچ گەل، لەباخ سێ سێوم خوارد، با هەڵی کرد گەڵای دارەکەی بە سەرمدا وەراند، گەڵاکانیشم خوارد، کابرایەکی گۆزەڵە بەدەستیشم خوارد. تازە بووکێکیشم خوارد. ئێستا ئێوەش دەخۆم.» کچەکان گوتیان: «بە دەرزی، چاوت دەردێنین.» مشکی برسی ئەوانیشی خوارد

ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە چەند کوڕێک ، مێشێنیان دەکرد. گوتی : «هۆی کوڕگەل! لەباخ سێ سێوم خوارد. با هەڵی کرد گەڵای دارەکەی بەسەرمدا وەراند ، گەڵاکانیشم خوارد، کابرایەکی گۆزەڵە بەدەستیشم خوارد. تازە بووکێکیشم خوارد. کچانی گوڵدۆزیکەریشم خوارد. ئێستا ئێوەش دەخۆم.» کوڕەکان گوتیان : «کەللا بارانت دەکەین.» مشکی برسی ئەوانیشی خوارد.

ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە پیرێژنێک. گوتی : «هۆی پیرێژن! لەباخ سێ سێوم خوارد. با هەڵی کرد گەڵای دارەکەی بەسەرمدا وەراند، گەڵاکانیشم خوارد، کابرایەکی گۆزەڵە بەدەستیشم خوارد. تازە بووکێکیشم خوارد. کچانی گوڵدۆزیکەریشم خوارد. کوڕانی مێشێنکەریشم خوارد. ئێستا تۆش دەخۆم!» پیرێژن گوتی : «لەدەورت گەڕێم خۆ من هەر پێست و ئێسقانم، تۆ تێر ناکەم، چێشتێکی خۆشم لێناوە، ڕاوەستێ بچم بۆت بێنم بیخۆ.» مشک گوتی : «باشە برۆ بیهێنە بەڵام زوو وەرەوە.»

پیرێژن پشیلەیەکی ئازا و قەڵەوی هەبوو. چوو پشیلەکەی خستە داوێنی کراسەکەیو
هێنای و لەبەر دەمی مشکەکە، بەری دا و گوتی: «هانێ بیخۆ.»
مشک چاوی بە پشیلە کەوت، بۆی دەرچوو. پشیلە وە دووی کەوت، بەڵام بۆی نەگیرا.

**مشک خۆی بە کونە دیوارێکدا کرد. پشیلە لە پەنا دیوارەکە خۆی شاردەوە. دوای تاوێک مشک سەری لە کونەکە هێنا دەرێو بۆ ئەملاو لای ڕوانی. پێی وابوو پشیلەکە ڕۆیوە. ئەوجار بە تەواوی لە کونە دیوارەکە هاتە دەرێ.**

پشیلە خۆی پێداداو گرتی و زگی دڕی. کابرای گۆزەڵە بەدەست هاتە دەرێ. تازە بووک هاتە دەرێ. کچەکان هاتنە دەرێ. کوڕەکان هاتنە دەرێ.

ئەمجار تێکڕا چوون هەر یەکەو خواردەمەنییەکیان هێنا پشیلە بیخواو قەڵەوتر بێ.

فهرست کتاب های انتشارات علمی کالج
« ویژه کودکان و نوجوانان »
۱- توانایی های من
عارف قانعی
۲- شب و ماه و ستاره
فردین صادق ایوبی
۳- جوجه له زه رده
سیمین چایچی
۴- نه شمیل
صلاح الدین حسین پناهی
۵- گربه بلا
رمان دهزنی
۶- که رویشکی ئازا
کمال احمدی
۷- دنیای بی گه رد
عبدالرحمان فهیمی
۸- جوجیگه مرپوپه لار
علیرضا قاسمی فر
۹- دختر آسیابان
فرانک کاظمی
انتشارات علمی کالج

انتشارات علمی کالج

ئەم کتێبانەش بۆ منداڵان لەم وەرگێڕە چاپ و بڵاو کراوەتەوە :

١ـ شادی (شێعر)

٢ـ ئاشتی (شێعر)

٣ـ دنیای بێگەرد (شێعر)

٤ـ کۆتر و مێرووولە (چیرۆک)

٥ـ نیان و پەپوولە (چیرۆک)

٦ـ ئازار (چیرۆک)

٧ـ شێتە و ژیرە (چیرۆک)

٨ـ ئاڵا (چیرۆک)

٩ـ گردنبند ابی (لە کوردیەوە بۆ فارسی) ملوانکەی شین

١٠ـ زەماوەندی مشکە خان (چیرۆک)